وتەكانی پاولۆ كۆیلیۆ

﴿٢﴾

# عاشقانە

وەرگێڕانی

یوسف محەممەد و كارا فاتیح

كوردستان – هەولێر

٢٠٠٦



**ناوی کتێب: عاشقانە**

– وتەکانی پاولۆ کۆیلیۆ
– وەرگێڕی فارسی: نەفیسەی سوڵتانی
– وەرگێڕانی بۆ کوردی: یوسف محەممەد و کارا فاتیح
– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
– بەرگ: سەیوان سەعیدیان
– پیتچنین و هەڵەچن: کارا فاتیح
– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
– تیراژ: ١٠٠٠ دانە
– ژمارەی سپاردن: ٤٠٦
– چاپی یەکەم
– نرخ: ١٥٠٠ دینار

زنجیرەی کتێب – ٦٩– (١٧٢)

ناونیشان
دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com





ئەو لاوەی فەرامۆشی دەکات گوڵێك بە مەحبووبەکەی بدات، سەرەنجام لەدەستیشی دەدات

❁ ❁ ❁

بە وەها عەشقێکی نێو دڵتەوە بژی، کە ئەگەر تەنانەت بە هەڵەش رۆیشتی بۆ جەهەندەم، خودی شەیتان تۆ بۆ بەهەشت بگەڕێنێتەوە

❁ ❁ ❁

هیچ شتێکی باڵاتر لە عەشق بوونی نییە.

❁ ❁ ❁



خراپترین رێگای پاراستنی هەر هاوسەرگیرییەك، مەحرووومکردنی ئەوی ترە لە ئازادییەکانی.

❁ ❁ ❁

نابێت رێگە بدەین، رۆحمان بەهۆی پەژارە و پەشیمانییەوە بسوێت.

❁ ❁ ❁

خودایە کارێك بکە، کە هەمیشە بتوانین پارێزگاری لە مەشخەڵی ئومێد و خۆڕاگری لە دڵماندا بکەین.

❁ ❁ ❁





ئەگەر بەڕاستی دەتانەوێت عەشقکردن فێربن، ئەوا فێربن کە ئازادبن.

❋ ❋ ❋

سەردەمی پیریمان پەیوەندیی بە چۆنێتیی ژیانمانەوە هەیە.

❋ ❋ ❋

ژیان سەقامگیرە.

❋ ❋ ❋

عەشق نە گەورەیە و نە بچووك. عەشق تەنها عەشقە.

❋ ❋ ❋



تەنهائەرکی مرۆڤ، عەشقکردنە.

❋ ❋ ❋

مرۆڤ پێویستی بە یاسایەکی تاکانە (عەشق) ە، بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ جیهانی رۆحانی و مەعنەویدا لە پاکێتییەکی تەواودا هاوژیانی بکات.

❋ ❋ ❋

عەشقی حەقیقی چاوەڕێی پاداشت نییە، بەڵام شیاویەتی.

❋ ❋ ❋

عەشق واتە خودا و، مەرگ بەواتای ئەوەیە دڵۆپێك لەم عەشقە دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکەی.

❋ ❋ ❋





هەوڵبدە هێندەی دەتوانیت بۆ مەعشووقەکەت عەشق بکە.

❁ ❁ ❁

راستییەکانی عەشق هەروەك ئۆقیانووسێکی روونن، کە بەزەحمەت دەتوانرێت لە رووی سەرەوەی تێپەڕین.

❁ ❁ ❁

هەرچەندە زیاتر عەشق لەگەڵ کەسێکدا بکەین، زیاتر دەچینە نێو نهێنییەکانییەوە.

❁ ❁ ❁

لەوێدا کە دەرەتانی نەفرەت هەیە، دەرەتانی عەشقیش هەیە. تەنها هێندە بەسە لە نێوان ئەم دوانەدا یەکێکیان هەڵبژێرین.

❁ ❁ ❁



ئەو چرکەساتەی کە جوامێریی نیشاندانی عەشقمان هەیە، مەیلی خۆمان بۆ ژیان سەرلەنوێ دەدۆزینەوە.

❁ ❁ ❁

خۆزگەخواستن بە عەشق، ئەزموونێکی سواڵکەرانەیە.

❁ ❁ ❁

عەشقی حەقیقی تەنها کاتێك جیلوەدەدات، کە ئاگری شەهوەتی سەرەتایی دابمرکێتەوە و پارچە سووتاوەکانی بگۆڕێت بۆ خۆڵەمێش.

❁ ❁ ❁

خوداوەند لە شەوە بێدارییەکاندا لەگەڵ تۆیە و ئەسرینەکانت بە عەشقی خۆی دەسڕێت.

❁ ❁ ❁





سەرکەوتن و شکست بەشێکن لە ژیانی هەر بنیادەمێك.

❈ ❈ ❈

کەسێك کە ناتوانێت لەگەڵ ئەوانی تردا دەرگای خۆشەویستی بخاتەسەرپشت، سرووشتییە کە لەمە کەنارگیریی بکات.

❈ ❈ ❈

پیاوەکان چێژێکی غەریب لە هەستی خۆبەزلزانین وەردەگرن، نازانن لە زۆرێك لە حاڵەتەکاندا بەشێوەیەکی تەواو پێشبینیکراو رەفتاردەکەن.

❈ ❈ ❈

هەموو رۆژێك، رۆژی چاوەڕوانییە.

❈ ❈ ❈



دوو شت دەتوانێت لەبەردەم مرۆڤدا بۆ دەستەبەربوونی خەونەکانی، رێگربێت: ئەوەی کە پێی وا بێت خەونەکانی نامومکینن، یان بە سووڕانەوەیەکی کتوپڕی چەرخی فەلەك، دروست ئەو کاتەی هیچ چاوەڕێی ناکات، ببینێت وەدیهاتنیان مومکین بوە.

❈ ❈ ❈

عەشقکردن ئەزموونێکی شاهانەیە، چونکە هەروەك ئیمپراتۆرێك رفتاردەکرێت.

❈ ❈ ❈

لە عەشقدا ناکرێت هەموو شتێك پێشبینی بکرێت.

❈ ❈ ❈

کۆکردنەوەی عەشق واتە شانس و، خەزێنەکردنی نەفرەت واتە چەرمەسەری.

❀ ❀ ❀

ئەگەر بە زمانی خەڵك و فریشتان قسەبکەین و عەشقمان نەبێت، هیچین.

❀ ❀ ❀

ئەگەر خاوەنی بەهرەی پێشگۆیی بین و لەمەڕ هەموو نهێنییەکان و تەواوی زانستەکاندا بەئاگابین و عەشقمان نەبێت، هیچین.

❀ ❀ ❀

عەشق خۆڕاگرە، عەشق میهرەبانە.

❀ ❀ ❀



عەشق لە ئاگری ئیرەییدا ناسووتێت.

❀ ❀ ❀

عەشق بەرژەوەندیی خۆی ناوێت.

❀ ❀ ❀

پێشگۆییەکان لەناودەچن، زمانەکان کۆتاییان دێت و زانستەکان ئاوادەبن، چونکە زانتەکانمان و پێشگۆییەکانمان شتێکی بچووکن، بەڵام هەر عەشقە کە هەرگیز لەناو ناچێت.

❀ ❀ ❀

سێ شت دەمێننەوە: ئیمان، ئومێد و عەشق، بەڵام باشترینیان عەشقە.

❀ ❀ ❀





لەسەروو هەموو شتێکەوە بە حەماسی تەواوەوە، عەشق لەگەڵ یەکتریدا بکەن، چونکە عەشق داپۆشەری زۆرێك لە گووناهەکانە.

❁ ❁ ❁

خوداوەند عەشقە.

❁ ❁ ❁

کاتێك بەخشندانە بۆ دونیا نیگایەك دەکەیت، نێوچەوانی فریشتەی تۆ دەردەکەوێت.

❁ ❁ ❁

کاتێك کەسێك ڕێگەکەی هەڵدەبژێرێت، نابێت بترسێت.

❁ ❁ ❁



ئەوە زمانی دڵی تۆیە کە شێوازی دیتنەوەی ڕاستیت فێردەکات.

❁ ❁ ❁

هەموو شتێك لەم ژیانەدا ناسەقامگیرە.

❁ ❁ ❁

خودایە، ڕەحمێ بکە بەوانەی دڵیان بۆ خۆیان دەسووتێ، چونکە خۆیان بە باش دەزانن و وا گوومانەدەبەن کە ژیان لەگەڵ ئەماندا نادادپەروەرانە ڕەفتاری کردوە، ئەمان هەرگیز ناتوانن خەریکی ململانێیەکی دروست بن.

❁ ❁ ❁

هەموو کەسێك بە شێوازی خۆی ژیان دەبینێ و بە شێوازی خۆی کێشە و سەرکەوتنەکانی تاقیدەکاتەوە.

❁ ❁ ❁

ئەگەر ئیمانم ئەوەندە کامڵ بێت تا ئەو شوێنەی کێوەکان جێگۆڕکێ پێ بکەم بەڵام عەشقم نەبێت، هیچم.

❋ ❋ ❋

ئەگەر هەموو سامانـم بەسەر فەقیراندا دابەشبکەم، ئەگەر جەستەی خۆم بە ئاگر بسپێرم بەڵام عەشقم نەبێت، هیچ بەرهەمێکم نابێت!

❋ ❋ ❋

عەشق بە ناڕاستی شاد نابێت، بەڵام بە راستی کەیفساز دەبێت.

❋ ❋ ❋

عەشق هەمیشە خۆڕاگرە.

❋ ❋ ❋



سەرەنجامی شەریعەت، عەشقە.

❋ ❋ ❋

کە عەشق بکەن لە سەرووی شەریعەتەوەن، تەنانەت ئەگەر لەمەش بەئاگانەبن.

❋ ❋ ❋

عەشق یاسایەکە، لەناو خۆیدا تەواوی یاساکانی تر کورتدەکاتەوە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر جەستەتان بۆ خاتری خواوەند بسووتێنـرێت، بەڵام عەشقتان نەبێت، هیـچ بەهایەکی نابێت، هیـچ.

❋ ❋ ❋

خوداتان زۆرتر لە هەموو شتێك خۆشبوێت.

❁ ❁ ❁

عەشق پێویستی بەوەیە، پەیڕەوی لە یاساکانی خودا بکەین.

❁ ❁ ❁

ئیمان تەنهاڕێیە، کە دەمانگەیەنێتە بالأترین پلەی عەشق.

❁ ❁ ❁

چاکەکاری تەنها یەکێکە لە دەرکەوتەکانی عەشق.

❁ ❁ ❁



ناتوانن هیچ کارێك بکەن، کە گرینگتربێت لە دووبارە درەوشاندنەوەی عەشق لە ژیانتاندا.

❁ ❁ ❁

عەشق شتێکە لە شتەکانی تر پێکهاتوە.

❁ ❁ ❁

عەشق سوودی خۆی ناوێت. عەشق تووڕە نابێت.

❁ ❁ ❁

هیچ ڕەهنێکی شەریفتر لە ڕەهنی عەشق نییە.

❁ ❁ ❁

**عەشق دەستمایەی راستەقینەی ژیانە.**

❋ ❋ ❋

**ئەو شوێنەی عەشقی لێ بێت، مرۆڤەکان و خودا هەن.**

❋ ❋ ❋

**خودا عەشقە، کەواتە عەشق بکەن!**

❋ ❋ ❋

**بەبێ جیاوازیکردن، بەبێ کاتی دیاریکراو، بەبێ گریمانە و بەبێ ترس لە ئازار عەشق بکەن!**

❋ ❋ ❋



**عەشقی خۆتان بێپسانەوە پێشکەشی فەقیران بکەن، کە ئاسانە.**

❋ ❋ ❋

**عەشقی خۆتان بێپسانەوە پێشکەشی ئەو بەتوانایانە بکەن، کە متمانەیان بە کەس نییە و ناتوانن عەشقێك ببینن، کە چەند پێویستیان پێیەتی.**

❋ ❋ ❋

**عەشق رازی ژیانە.**

❋ ❋ ❋

**بهێڵن ئەوانی تر عەشق بکەن و هەوڵبدەن خۆشتان بەردەوام عەشق بکەن.**

❋ ❋ ❋

تاقانه ڕێگای هەڵهاتن له ئیرەیی، چڕکردنەوەی هەموو هێزەکانه له عەشقدا.

❁ ❁ ❁

تەنها دەبێت ئیرەیی به یەك شت بەرم: به ڕۆحی گەورە، به دەوڵەمەندی و سەخاوەتمەندیی ئەوانەی عەشق دەناسن و له ئاگری ئیرەییدا ناسووتێن.

❁ ❁ ❁

عەشق شت دەشارێتەوە، تەنانەت خۆشی.

❁ ❁ ❁

کەسێك له دڵیدا عەشق هەبێت، ناتوانێت ڕەفتاری ناشیرینی بنوێنێت.

❁ ❁ ❁



بۆ عەشق هیچ شتێك دژوار نییه.

❁ ❁ ❁

عەشقێك که به دوای پاداشتەوە نییه، دەتوانێت هەر چرکەساتێکی بوونی به نووری خۆی لێوڕێژبکات.

❁ ❁ ❁

کەسێك که بەدوای شادییەوە بێت، دەبێت ڕەفتاری خۆی لەگەڵ ژیاندا له عەشق هەڵکێشێت.

❁ ❁ ❁

عەشق مرۆڤ دەگۆڕێت، کەواته بهێڵن بێته ناوەوە.

❁ ❁ ❁





باشترە زیندوو نەبم، ئەگەر عەشقم نەبێت.

❋ ❋ ❋

خودا عەشقە، عەشقێك ئەو كاتەی دێتە نێو دەروونمانەوە: نەرمدەكات، پاكژدەكاتەوە، تازەدەكاتەوە، چاكسازیدەكات و، دەروونی مرۆڤ سەرلەنوێ دروستدەكاتەوە.

❋ ❋ ❋

راكێشانی متمانەی خەڵكی، كەمێك بە عەشق نزیكبوونەوەیە.

❋ ❋ ❋

پەرستش و تەقوای راستەقینە كاتێك لە ژیانی مرۆڤدا دەردەكەوێت، كە خاوەنی ئارەزوێكین و ئەگەر سەركەوتوونەبین، بەدەستی بهێنین ئەوا دەمرین.

❋ ❋ ❋



تاگگەرایی بەرەو نائومێدی و تەنهایی پەلكێشمان دەكات.

❋ ❋ ❋

ئەو كاتەی بۆ ئامانجێكی دیاریكراو یەكگرتوویی هەبێت، هیچ بەربەستێك ناتوانێت ببێتە رێگر.

❋ ❋ ❋

بەشداریكردن هەم بۆ شادی و هەم بۆ پارێزگاریكردن لێمان، پێویستە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر ئازایەتیی كوشتنی خۆمانمان هەیە، كەواتە ئازایەتیی بەردەوامیدان بە ژیانی خۆشمان هەیە.

❋ ❋ ❋





ژیان بۆ نواندنی جوانی و ئەبەدیەتی خود، پێویستی بە نیشانە پەنهانەکان نییە.

❁ ❁ ❁

ئەو کە عەشق دەکات براوەیە، هەرچەندە لەدووی پاداشتێکدا نییە.

❁ ❁ ❁

کەسێك کە عەشقکردن دەناسێت هێندەی هاوجۆرەکەی راستیی خۆشدەوێت.

❁ ❁ ❁

عەشقی راستەقینە دانەوەی لاوازی نییە بەرووی ئەوانی تردا، بەڵکو قبووڵکردنی هەموو شتێکە.

❁ ❁ ❁



عەشق چرکەساتێکی شەیدایی نییە.

❁ ❁ ❁

عەشق دەرکەوتەیەکی بەهێز و سەخاوەتمەندە لە ژیانمان: کەسایەتیی مرۆڤ لە کاملترین قۆناغی گەشەی خۆیدا.

❁ ❁ ❁

جیهانە کە عەشقکردنمان فێردەکات.

❁ ❁ ❁

گریان بەشێکە لە ژیان.

❁ ❁ ❁





هەرگیز فەرامۆشی مەکە کە لە ئاشکراکردنی هەستەکانت ئازادیت و، ئەم کارە بە هیچ شێوەیەك شەرمهێنەر نییە.

❁ ❁ ❁

دەبێت بۆ خاتری خەونەکانمان بجەنگین.

❁ ❁ ❁

شادبوون گووناه نییە.

❁ ❁ ❁

خۆت سەرزەنشت مەکە، ئەگەر هەندێجار کاتی خۆت لەگەڵ ماسوولکەکانت بەهەدەردەدەیت، ئەم کارانە چەند خۆشییەکی بچووکن و تۆ هاندەدەن بۆ کارە گەورەکان.

❁ ❁ ❁



مرۆڤ هیچ کات ناتوانێت ئەوەی ئارەزووی دەکات، فەرامۆشی بکات.

❁ ❁ ❁

عەشق هەرگیز ناتوانرێت پێناسە بکرێت.

❁ ❁ ❁

لەوانەی کە عەشقکردن فێربوون، سەرمەشق وەربگرن.

❁ ❁ ❁

عەشق دەکەین، چونکە سەرەتا ئەو عەشقی لەگەڵ ئێمە کردوە.

❁ ❁ ❁

روانین بۆ خودی عەشق، شەیدابوون و کۆپیکردنیەتی.

❁ ❁ ❁

عەشق، عەشق دەئافرێنێت.

❁ ❁ ❁

عەشق چڵکی نێو دڵی مرۆڤ دەتوێنێتەوە و دەیگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی نوێ: بوونەوەرێکی خۆڕاگر، خاکەڕا، گونجاو و میهرەبان.

❁ ❁ ❁

عەشق هەرگیز لەناوناچێت.

❁ ❁ ❁



مەهێڵن عەشقی ئێوە یەخسیری ئازارەکانی ئەم جیهانە بێت.

❁ ❁ ❁

ئەگەر دەتانەوێت خۆتان تەسلیمی چەند شتێك بکەن، سەرەتا تەسلیمی عەشق بن.

❁ ❁ ❁

بەدوای عەشق، بەدوای چرکەساتێکی جاویدانیدا بڕۆن، وەدووی تاکە شتێکدا کە تا ئەو ڕۆژەی جۆری مرۆڤ بە کۆتا ڕۆژگاری خۆی دەگات، دەمێنێتەوە.

❁ ❁ ❁

عەشق تەنها پارەیەکە کە جیهان قبووڵی دەکات. ئەو کاتەی هەموو سکەکانی تر لە هەموو نەتەوەکانەوە بەها و بەکارهێنانی خۆیان لەدەستدەدەن.

❁ ❁ ❁

عەشقی ڕەها دەتوانێت کێبەرکێی عەشق بۆ ئەم جیهانە بکات.

❁ ❁ ❁

کاتێك مرۆڤ کەسێکی نەبێت خۆشی بوێت، مەیلێکی قووڵ بۆ مەرگ دەروونی دەتەنێ.

❁ ❁ ❁

ناسینی عەشق، واتە ئامادەبوون لە ژیانی جاویدانیدا.

❁ ❁ ❁

عەشق هەرگیز هەڵەناکا و، ژیان تا ئەو کاتەی عەشق هەیە بەهەڵەدا ناڕوات.

❁ ❁ ❁



تا ئەو کاتەی هەموو شتێك بە کۆتادەگات، عەشق دەمێنێتەوە.

❁ ❁ ❁

عەشق ژیانە.

❁ ❁ ❁

ئەگەر هەنووکە سۆراغی نەکەین و بەو ئەزموونەدا گوزەرنەکەین، کاتی پیری کەمترین فرسەتمان بۆ فێربوونی عەشقکردن هەیە.

❁ ❁ ❁

دەبێت متمانەمان بەو توانایە هەبێت، کە هەر کەسێك بۆ فێربوونی خۆی هەیەتی.

❁ ❁ ❁





لۆژیك هەرگیز ناتوانێت بەتەواوی بەسەر هەستەكاندا زاڵ بێت.

❋ ❋ ❋

باشترین شێوەی لەناوبردنی پردی نێوان جیهانی بینراو و نەبینراو هەوڵدانە بۆ شرۆڤەكردنی هەستەكان.

❋ ❋ ❋

ئێمەین لێپرسراوی جیهان، چونكە ئێمە خودی جیهانین.

❋ ❋ ❋

تەنها ئەو كاتەی كە رووبەڕووی مەسەلە ئاڵۆزەكان دەبینەوە، دەتوانین لە مەسەلە سادەكان تێبگەین.

❋ ❋ ❋



دڵ بڕیاردەدا و تەنها شتێك بەڕاستی گرینگە هەمان ئەو بڕیارەیە كە دڵ دەیدا.

❋ ❋ ❋

عەشق لە خۆپەسەندی خۆدەپارێزێت.

❋ ❋ ❋

كەسێك كە عەشق دەكات، ئازادە.

❋ ❋ ❋

ئەوەی كە نە عەشق دەكا و نە مەعشووقە، لە هەموو شتێك بێبەشە.

❋ ❋ ❋

ئەو کەسەی لە شادیدا عەشق دەدۆزێتەوە، لە خودادا شادی دەدۆزێتەوە، چونکە خودا عەشقە!

❋ ❋ ❋

نەگریسترین چارەنووس کە دەشێت کەسێك دووچاری ببێت، بەتەنها ژیان و بەتەنها مردنە، بێ عاشقبوون و بێ مەعەشقبوون.

❋ ❋ ❋

بەرەوپێشچوونەکان و گرینگترین چرکەساتەکانی ژیان، ئەوانەن کە رۆحی عەشق تێیاندا ئامادەیە.

❋ ❋ ❋

چرکەساتە بە بەهاکانی بوونی ئێمە هەر ئەوانەن کە تیایاندا لەگەڵ عەشقدا ژیاوین.

❋ ❋ ❋



ئەوەی کە بۆمان دەمێنێتەوە، شێوازی ئێمەیە بۆ عەشقکردن لەگەڵ هاوجۆرەکەماندا.

❋ ❋ ❋

گرینگترین وانەیەك کە دەبێت بەیەکدی بلێینەوە، فێربوونی عەشقکردنە.

❋ ❋ ❋

عەشق لێرەیە، لە ئێستای ئێمەدا ئامادەیە، لەم چرکەساتەدا.

❋ ❋ ❋

ژیان تەنها دەرفەتێکە بۆ فێربوونی عەشق.

❋ ❋ ❋





عەشق هەرگیز گزی ناکات.

❈ ❈ ❈

ڕەوانیی بێدەنگیی عەشق وادەکات، کە هەموان مەبەستمان تێبگەن.

❈ ❈ ❈

عەشق لە ژیاندا تەنها دەبێت ئەزموون بکرێت، بێسوودە بیستنی ئەزموونی خەڵکانی تر دەربارەی.

❈ ❈ ❈

تەنها عەشق توانای هەڵهاتنمان پێدەبەخشێت.

❈ ❈ ❈



تەنها عەشق بەندایەتی دەگۆڕێت بۆ ئازادی.

❈ ❈ ❈

هەوڵی ئێمە بۆ بێنیاز دەرکەوتنمان، هەلی دەربڕینی عەشق لە خەڵکی تر دەگرێتەوە.

❈ ❈ ❈

عەشق هەرگیز ڕێی بەدواداچوونی خەونی لە کەس نەگرتوە.

❈ ❈ ❈

ئەگەر ناتوانین عەشق بکەین، وا باشترە یەکسەر بوەستین.

❈ ❈ ❈





عەشقکردن بەزۆری ئاسانترە لە مەعشووقبوون.

❋ ❋ ❋

عەشق نە دەدرێت و نە وەردەگرێت، عەشق شەریکبوونە.

❋ ❋ ❋

وەرن با هەرگیز فەرامۆشی نەکەین، کە عەشق واتە ناسکی.

❋ ❋ ❋

لە هەموو ئەو ڕێیانەی مرۆڤ بۆ ئازاردانی خۆی دۆزیویەتییەوە، عەشق خراپترینیانە.

❋ ❋ ❋



تەنها پەیوەندییە، ڕێنوێنیمان دەکات بۆ شەیدایی کە شێوەی هەرە باڵای عەشقە.

❋ ❋ ❋

بەشێکی گرینگی وانەی ژیان ئەوەیە، کە لەگەڵ هەلومەرجەکاندا چەنەچەنێ نەکەین.

❋ ❋ ❋

هەموو ڕۆژێ موعجیزەی تایبەت بە خۆی هەیە: بەهرەکانی ئەمڕۆ قبووڵبکەین و بەکاریان بهێنین.

❋ ❋ ❋

ئەو شوێنەی زۆرداری دەتوانێت لەناوی بەرێت، ناسکی دەتوانێت ڕۆڵی خۆی تێدا بگێڕێت.

❋ ❋ ❋

بەبێ ترسان لە گریان، ناتوانین پێبکەنین.

❋ ❋ ❋

جەنگەڵ هەمیشە لە درەختی تاك بەهێزترە.

❋ ❋ ❋

ئەشك بەهرەیەکە رۆحمان پاکژدەکاتەوە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر لە شەقامی خەونەکانتدا هەنگاوهەڵبگریت، دڵی بەرێ و دەرگایەك بۆ بەهانەکانی وەك (ئەمە ئەو شتە نییە کە دەمەویست.) مەهێڵەرەوە، چونکە لەم کارەدا تۆوی شکست و ناکامی شاردراوەتەوە.

❋ ❋ ❋



هەندێ شت هەن لە ژیاندا شتێك لەسەری نووسراوە بەم واتایە: (تۆ قەدری من نازانیت، مەگەر بەوەی لەدەستم بدەیت و دووبارە بەدەستم بهێنیتەوە.)

❋ ❋ ❋

ژیان وەك پێشبڕکێیەکی گەورەی پاسکیلسواری وەهایە، کە ئامانجی بریتییە لە ژیان بەپێی ئەفسانەی کەسی.

❋ ❋ ❋

ژیان سەررێژە لە بەڵێن: بەڵێنی سامان، رزگاریی ئەبەدیی و عەشقی رەها.

❋ ❋ ❋

هەموو ئەو شتانەی فێریان بووین هیچ مانایەکیان نابێت، ئەگەر لە خۆمان رازی نەبین.

❋ ❋ ❋





ئەگەر مرۆڤ ئارەزووی شتێك دەكات، دەبێت ئامانجی ڕۆیشتن بۆ بەدەستهێنانی هەبێت.

❁ ❁ ❁

خودایە، ڕەحمێ بكە بەوانەی لە ترسی خۆشویستن دەمرن و، عەشق لە خۆیان حەرامدەكەن.

❁ ❁ ❁

عەشق پێویستی بە خستنە بەر باس و لێكۆڵینەوە نییە

❁ ❁ ❁

كاتێ عاشقین، كاتێ لە ناخی ڕۆحماندا بە شتێك ئیمانمان هەیە، خۆمان لە هەموو دونیا بە بەهێزتر دەزانین.

❁ ❁ ❁



هیچ وشەیەكی باشتر لە عەشق نییە.

❁ ❁ ❁

كاتێ عاشقین ئارامییەك بەسەرماندا زاڵ دەبێت، كە لە متمانە بە ئامانج و عەشقمانەوە سەرچاوەدەگرێت و، لەمەی كە هیچ شتێك ناتوانێت ئەو ئیمانە لە ئێمە وەربگرێت.

❁ ❁ ❁

لە هەر هەنگاوێ كە هەڵیدەگری، لە هەر چركەساتێكی هەستانەوە پشت بە هێزی ئەو عەشقەی هەموو شوێنێك دەگرێتەوە، ببەستە.

❁ ❁ ❁

شەهوەت ئەفسوونێكە، بەختی خۆت بەو شتانەی فەرامۆشكراون، تاقیمەكەرەوە.

❁ ❁ ❁





هەندێ لە بڕیارەکان پێویستیان بە ئاگری هەڵچوون هەیە.

❋ ❋ ❋

ئەی جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی بوونەوەر: ئیمان، ئومێد و عەشقت هەبێت.

❋ ❋ ❋

کەسێك ئیمان، عەشق و ئومێدی هەبێت، بەدرێژایی ڕێگا دوودڵ نابێت.

❋ ❋ ❋

تەنها یەك شت لە شادی گرینگترە: پیرۆزی.

❋ ❋ ❋



عەشقە سووتێنەرەکانی سەردەمی منداڵی، عەشقە مەحاڵەکانن.

❋ ❋ ❋

دەبێت لە نێوان مووحیبەت و سەرسەختیدا، هاوسەنگییەکی باش بەرقەرار بکەین.

❋ ❋ ❋

بۆ خزمەتکردن بە خودا، ڕێگاگەلێکی زۆر هەن، عەشقی ئێمە تەنها ژمارەی ئەم ڕێگایانە چەند بەرامبەر دەکات.

❋ ❋ ❋

ئەمە ڕەحمەتە گەر مرۆڤ بزانێت چۆن بە سەربڵندی و عەشقەوە بژی.

❋ ❋ ❋

عەشقیش هەروەك ژیان لەپێشەوە بوونی هەبوە، تا ئەبەدیش بەردەوام دەبێت.

❁ ❁ ❁

هەرگیز نابێت بەڕاشکاوی قسە لەمەڕ عەشقەوە بکرێت، بەتایبەت بۆ کەسانێك کە باش نایانناسین.

❁ ❁ ❁

جەنگان گووناه نییە، جەنگان کارێکی عاشقانەیە.

❁ ❁ ❁

ناوکرۆکی بوونەوەر تاکانەیە و ئەم ناوکرۆکە ناوی عەشقە.

❁ ❁ ❁



عەشق هێزێکە، جارێکی تر ئێمە بەیەکترەوە دەبەستێتەوە، تا سەرلەنوێ ئەو ئەزموونەی لە ژیانی جۆرارجۆر و لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا پەراگەندە بوە، کەڵەکە بێت.

❁ ❁ ❁

عەشق تەنها پردێکە لە نێوان جیهانی بینراو و نەبینراودا، کە هەموو مرۆڤان دەیناسن.

❁ ❁ ❁

بۆ وەرگێڕانی ئەو وانانەی کە بوونەوەر هەموو رۆژێ فێری مرۆڤەکانی دەکات، عەشق تاقە زمانێکی کاریگەرە.

❁ ❁ ❁

بۆ ئازارنەچەشتن، عەشقنەکردن پێویستە.

❁ ❁ ❁





کەسێك کە عاشق دەبێ دونیا فەتحدەکات و، باکی لەوە نییە شتێك لەدەستبدات.

❁ ❁ ❁

هەرچەندە زیاتر عەشق بکەین، لە مەعنەویەت نزیکتر دەبینەوە.

❁ ❁ ❁

لە هەر عەشقێکدا تۆوی گەشەی ئێمە نێژراوە.

❁ ❁ ❁

عەشقی راستەقینە، کارکردنە لەڕووی تەسلیمبوونی تەواوەوە.

❁ ❁ ❁



ڕێگای مەعنەویەت تەنها بەنێو ئەو رەفتارە عاشقانانەدا گووزەردەکات، کە هەموو رۆژێك ئەنجامدەدرێن.

❁ ❁ ❁

عەشق هیچ یاسایەکی نییە.

❁ ❁ ❁

کەسانێك کە بەهۆی راستییەوە دەگەنە هۆشیاری، کەسانێك عەشق رۆحیانی رۆشنکردۆتەوە، توانیویانە بەسەر هەموو کۆتوبەند و بەربەست و حەزەکانی سەردەمی خۆیاندا زاڵ بن.

❁ ❁ ❁

عەشق جێبەجێکردنی شەریعەتە.

❁ ❁ ❁

عاشقبوون، پەیوەندی و هاودڵییە لەگەڵ ئەوی تر و، کەشفکردنی نووری خودایە لە بوونیدا.

❁ ❁ ❁

هەموو داستانەکانی عەشق، یەك داستان زیاتر نین.

❁ ❁ ❁

عەشق پێش ئەوەی سەردەمی پیرێتیمان بگات پیرمان دەکا و، یان ئەگەر لاوێتیمان بەسەرچووبێت، لاومان دەکاتەوە.

❁ ❁ ❁

یەك (بەڵێ) یان (نەخێر) ێك، دەتوانێت ژیانی مرۆڤێك تا ئەبەد بگۆڕێت.

❁ ❁ ❁



عاقڵان تەنها لەبەرئەوەی کە عاشقن، عاقڵن.

❁ ❁ ❁

گەمژەکان تەنها لەبەرئەوەی وەها بیردەکەنەوە کە دەتوانن لە عەشق بگەن، گەمژەن.

❁ ❁ ❁

لە ژیانی واقیعیدا عەشق دەبێت دەرەتانی هەبێت، تەنانەت ئەگەر وەڵامێکی دروستیشی نەبێت.

❁ ❁ ❁

عەشق تەڵەیەکە، وەختێ دەردەکەوێت تەنها رووناکییەکانی دەبینین نەك سێبەرەکانی.

❁ ❁ ❁

هیچ شتێکی قووڵتر لە عەشق نییە.

❋ ❋ ❋

عەشق بەهای ئەوەی هەیە، مرۆڤ تا دوا هەناسە بۆی بجەنگێت.

❋ ❋ ❋

هەر کەس ببێتە ڕێگر لەبەردەم دەرکەوتنی عەشقدا، بەرپرسیار دەبێت لە دووبارە ئافراندنیشیدا.

❋ ❋ ❋

تەنها شێوازی خوداوەند بۆ سزادان ئەوەیە، کە ئەو کەسەی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم کردارێکی عاشقانەدا، ناچاری دەکات تا درێژەی پێبدات.

❋ ❋ ❋



مرۆڤەکان عەشق تەنها لەگەڵ ئازار و قوربانیدا تێدەگەن.

❋ ❋ ❋

عەشق بە ئازادی لە هەر کەسێکدا دەردەکەوێت.

❋ ❋ ❋

هاوبەشیکردن لەگەڵ یەکتریدا، گەورەیی و شەرافەت بە عەشق دەبەخشێت.

❋ ❋ ❋

عەشقی ڕاستەقینە ئەو عەشقەیە کە هەمیشە دەڕوێ، جیهان دەبزوێنێ و مرۆڤەکان عاقڵدەکات.

❋ ❋ ❋





شتێ کە خۆراك بە بوونی ئێمە دەدا و پەروەردەی دەکات، عەشقە.

❋ ❋ ❋

عەشق دەنگی خۆی هەیە و بۆ خۆی قسەدەکات.

❋ ❋ ❋

لەو چرکەساتەوەی کە لە سۆراغی عەشقداین، خەریکی گەڕان بەدووی خۆمان و رزگاریی خۆمانین.

❋ ❋ ❋

عەشق دەتوانێت ئێمە بۆ دۆزەخ یان بەهەشت بەرێت، بەلاّم هەمیشە بۆ جێیەکمان دەبات.

❋ ❋ ❋



دەبێت لە هەر شوێنێکدا کە عەشق دەدۆزیتەوە، هەڵی بگریتەوە، تەنانەت ئەگەر ماناکەی چەندان کاتژمێر و چەندان رۆژ و چەندان هەفتە نائومێدی و غەم بێت.

❋ ❋ ❋

عەشق ئەگەر بە هەر نرخێکیش تەواو بێت، دەیهێنێت.

❋ ❋ ❋

ئەگەر دەست بنێین بە رووی عەشقەوە، لە برسان دەمرین.

❋ ❋ ❋

عەشقی راستەقینە بەکەڵکترە لە هەر شتێك و، باشترە مرۆڤ بمرێت تا ئەوەی کە نەتوانێت عاشق بێت.

❋ ❋ ❋

ئەو کاتەی بە جوامێرییەوە بەدوای عەشقدا دەگەڕێین، عەشق خۆی ئاشکرا دەکات.

❋ ❋ ❋

فەرامۆشی مەکە کە عەشق دەمێنێتەوە، ئەوەی دەگۆڕدرێت مرۆڤەکانن.

❋ ❋ ❋

خۆشەویستیی راستەقینە، بە تێپەڕبوونی کات دەگۆڕدرێت و گەشەدەکات و رێگەگەلێکی نوێ بۆ دەرخستنی خۆی دەدۆزێتەوە.

❋ ❋ ❋

هەموومان بەم جۆرە بارهاتووین کە تەنها خۆشمان بوێ، قبووڵ بکەین، بەدوای ئەو رێگایانەدا بگەڕێین کە بەتەنیشت مەسەلەکانەوە گووزەردەکەن و لە کێشمەکێشمەکان خۆبەدووربگرین.

❋ ❋ ❋



عەشق تەنها شتێکە، کە شکست ناخوات.

❋ ❋ ❋

عەشق هەمیشە هاوکاتە لەگەڵ نیگەرانی و ئازار: شادیی زۆر یان خەمی قووڵ!

❋ ❋ ❋

عەشقی فریشتەی مەرگ، کە رۆژێ رۆحمان دەبا و، عەشقی فریشتەی پاسەوان کە رۆحی ئێمە دەگەڕێنێتەوە: یەك شتن.

❋ ❋ ❋

تەنها گووناه: ونکردنی عەشقە.

❋ ❋ ❋

جوامێریتان هەبێت، لێوەشاوەییی خۆشویستنتان هەبێت، تەنانەت ئەگەر عەشق خیانەتپیشە و ترسناکیش دەربکەوێت.

❋ ❋ ❋

لە عەشقدا شادوومان بن، لە پیرۆزیدا خۆشحاڵ بن.

❋ ❋ ❋

شادی هەندێجار بەهرەیەکە کە پێماندەبەخشرێت، بەڵام زۆرجاران سەرکەوتنێکە.

❋ ❋ ❋

ژیان تەنها یەك شتی لە ئێمە دەوێت: بەشداریکردن!

❋ ❋ ❋



ئێمە تەنها ئەو کاتە موعجیزەی ژیان بەتەواوی درکپێدەکەین، کە رێگەبدەین ئەو شتەی چاوەڕێی ناکەین، رووبدات.

❋ ❋ ❋

عەشق ناتوانێت زبر و نەگوونجاو بێت، ناتوانێت رەفتاری نادروستی هەبێت.

❋ ❋ ❋

ئەگەر ئێمە لەدایکبوونەوەیەکی دووبارەمان نەبێت، ئەگەر نەتوانین فێربین بە پاکیزەیی و جۆشوخرۆشی منالییەوە لە دونیا بڕوانین، پاشماوەی ژیان هیچ مانایەکی نابێت.

❋ ❋ ❋

ئەو کاتەی ئارەزووی شتێك دەکەین، ژیان خودی ئێمە بەرەو ئەو شتە رێنوێنیدەکات.

❋ ❋ ❋





جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، جیهانی خۆی لەگەڵ ئەو
کەسانەی کە خۆشی دەوێن، بەشدەکات.

❃ ❃ ❃

دوو هەڵەی گەورە: یەکێکیان ئەمەیە کە بەر لە وادە
دەستبەکاربیت، ئەوی تریان لەدەستدانی هەلی گونجاوە.

❃ ❃ ❃

ئەو کاتەی کە بە ئامادەبوونی خەڵکانی تر بەرگری لە
هەندێ بیروباوەڕ و ئامانج دەکەین، دەبێت هەوڵبدەین بە
گونجاوی لەگەڵ ئەو ئامانج و بیروباوەڕانەدا بژین.

❃ ❃ ❃

نابێت زۆر لە جامی بەختەوەری بنۆشین، لەوانەیە خووی
پێوەبگرین، لەکاتێکدا هەمیشە لەبەردەستماندا نابێت.

❃ ❃ ❃



شادی کاڵایەك نییە، بە قۆرغکردنی زیاد بکات، هەروەها
شتێکیش نییە بە زیایەکردنی کەمبێتەوە.

❃ ❃ ❃

تەنها بە پەرشکردنەوەی عەشقە، دەتوانین پشکی خۆمان زیاد بکەین.

❃ ❃ ❃

ئەو زمانەی تەواوی دانیشتوانی زەمین لە دڵی خۆیاندا
تێیدەگەن، زمانی عەشقە.

❃ ❃ ❃

عەشق هەمان ئەو شتەیە، کە هەر کاتێك دوو نیگا
بەریەکدەکەون هێزی خۆی دەخاتەڕوو.

❃ ❃ ❃

زمانی عەشق، زمانی خاوێنی جیهانە کە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی پێویستی نییە، دروست هەر بەو جۆرەی سووڕی بوونەوەرەکان لە سەردەمە بێپایانەکاندا پێویستیان بە هیچ ڕوونکردنەوەیەك نییە.

❁ ❁ ❁

کاتێك زمانی عەشق بزانیت، بە ئاسانی بۆت دەردەکەوێت چ لە ناوەڕاستی بیاباندا بێت یان چ لە شارێکی گەورەدا، کەسێك لە چاوەڕوانیت دایە.

❁ ❁ ❁

عەشق فرمانێکە، ئاراستەکەری هەموو فرمانەکانی ترە.

❁ ❁ ❁

کاتێك دوو عاشق بە دیداری یەك دەگەن و نیگایان بەر یەك دەکەوێ، گرینگیی رابردوو و داهاتوو بەتاڵدەبێتەوە.

❁ ❁ ❁



عەشق تەنانەت بەدوای بچووکترین شتی خۆیدا نییە.

❁ ❁ ❁

ڕۆحی هەر ئینسانێك لەم جیهانەدا، تاکی خۆی هەیە.

❁ ❁ ❁

بەبێ عەشق خەونەکانی مرۆڤ هیچ مانایەکیان نییە.

❁ ❁ ❁

زمانی عەشق زمانێکە، تەمەنی لە مرۆڤایەتی زیاترە و کۆنیی لە بیابان بەرینتر.

❁ ❁ ❁

تەپۆلکە لە ڕەوانەکان، بەدەست باوە بەردەوام شێوە دەگۆڕن بەڵام بیابان هەرگیز ناگۆڕدرێت. عەشقی ئێمەش هەر بەم شێوەیەیە.

❁ ❁ ❁

عەشق ئەوەندە قووڵە، کە عاشق گرینگی بە هیچ پاداشتێك نادات.

❁ ❁ ❁

کاتێك عاشق بیت، هەموو شتێك بۆت پڕ مانا دەبێت.

❁ ❁ ❁

عەشق هەرگیز پیاو لە بەدواداچوونی ئەفسانەی کەسیدا ناگەڕێنێتەوە، ئەگەر لە بەدواداچوونیدا دەستی هەڵگرت، هۆکەی ئەوەیە عەشقەکەی واقیعی نەبوە.

❁ ❁ ❁



عەشقی ڕاستەقینە واتە عەشقێك کە بە زمانی جیهان دەپەیڤێت.

❁ ❁ ❁

عەشق فڕینی بایەقووشە بەسەر لەکاندا.

❁ ❁ ❁

ئەو کاتەی عاشقیت دەتوانیت هەر کارێك لە ئافراندندا ئەنجام بدەیت.

❁ ❁ ❁

هەمووومان موحتاجی عەشقین.

❁ ❁ ❁

کەسێك کە لێمان تێدەگات، دەتوانێت بمانگۆڕێت.

❁ ❁ ❁

رێزگرتن لە خەڵکی، ئەبێتە هۆی رێزگرتن لە خودی خۆمان.

❁ ❁ ❁

تەنها کاتێك دەتوانین یارمەتیی کەسێك بدەین کە متمانەمان پێی هەبێت.

❁ ❁ ❁

چ ناسروشتییە ژیانی ئەوانەی کە هەمیشە لە رۆشناییدان!

❁ ❁ ❁



ژیان پشوویەکی درێژ نییە، فێربوونێکی بەردەوامە.

❁ ❁ ❁

ئەو دەستە مەدەنە دواوە کە دەموچاوی ئێوە دەتاشێت، چونکە ئەم دەستە رێگەش نیشانی ئێوە دەدات.

❁ ❁ ❁

کاتێك کە عاشقیت، هەرگیز پێویست نییە بزانیت چی روودەدات چونکە هەموو شتێك لە ناخی تۆدا روودەدات.

❁ ❁ ❁

ئەگەر عەشق دەناسیت، کەواتە دەبێت رۆحی جیهانیش بناسیت، چونکە ئەویش لە رۆحی جیهان دروستبوە.

❁ ❁ ❁





کاتێك عاشق بیت هەمیشە هەوڵدەدەیت باشتر بیت لەوەی کە هەیت.

❋ ❋ ❋

عەشق هێزێکە، رۆحی جیهان دەگۆڕێت و بەرەو کامڵبوونی دەبات.

❋ ❋ ❋

لە تەنهایی مەترسێ.

❋ ❋ ❋

عەشقی ئێمە نە وەستانە وەك بیابان و نە پیاسەکردنە بەناو جیهاندا وەك با.

❋ ❋ ❋



کاتێك ئێمە هەوڵبدەین باشتر بین لەوەی کە هەین، هەموو بوونەوەرەکانی دەوروبەریشمان باشتر دەبن.

❋ ❋ ❋

عەشق بە ئەندازەی خواردن، خواردنەوە و خەوتن بەشێکە لە سروشتی ئینسان.

❋ ❋ ❋

ئەگەر رۆژئاوابوون چیتر مانایەکی بۆت نییە، خاکەڕایی بکە بە پیشەی خۆت و بەدوای عەشقدا بڕۆ.

❋ ❋ ❋

تەنهایی هەر وەك راهاتنە بە ترسناکترین مادەی بێهۆشکەر.

❋ ❋ ❋





ئەگەر توانای عەشقکردنمان هەبێت، ئەوا توانای مەعشووقبوونیشمان هەیە.

❁ ❁ ❁

بۆ عەشقکردن تەنها بڕێك كات پێویستە.

❁ ❁ ❁

دەبێت وریا بین، نابێت لە شکست بترسین.

❁ ❁ ❁

مرۆڤێك كە گوێگرتن نازانێت، ناتوانێت ئەو ئامۆژگارییانەی ژیان لە هەر چرکەساتێکدا بۆمان دەخاتەڕوو، ببیستێت.

❁ ❁ ❁



تەنها كەسێك كە گوێ بۆ دەنگی زەمەنی ئێستا رادەگرێت، دەتوانێت بڕیاری دروست بدات.

❁ ❁ ❁

جوانیی ژیان هەر لەمەدایە، كە لەوانەیە خەونەكانمان بەدیبێت.

❁ ❁ ❁

لاوان نە لە خەیاڵپلاوی دەترسن، نە لە ڕوودانی هەر ڕووداوێك كە لە دڵەوە ئارەزووی دەكەن.

❁ ❁ ❁

ڕێگاچارەی هەڵە دەمانگەیەنێتە ڕێگاچارەی ڕاست.

❁ ❁ ❁





عەشق هەمیشە بوونی هەیە.

❋ ❋ ❋

تەنانەت ئەو کاتەش کە بەتوندی هەست بە بێهوودەیی دەکەین، دیسانیش دەتوانین عەشق بکەین.

❋ ❋ ❋

عەشق بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئایا ئێمە لە ژیانماندا یەکجار عاشق بووین، یان دووجار، یان دوانزەجار هەمیشە تازەیە.

❋ ❋ ❋

هەمیشە دەتوانین بەبێ چاوەڕێکردنی پاداشت و سووپاس و رەفتاری هاوشێوە، عەشق بکەین.

❋ ❋ ❋



عەشق ترسناکە.

❋ ❋ ❋

عەشق جیهانێکی گەورەیە و تۆ دەبێت پاشماوەی تەمەنت بۆ تێگەیشتن لێی تەرخان بکەیت.

❋ ❋ ❋

راوچییە سەرکەوتوەکان وەها کاردەکەن: هەمیشە ئەوانەن کە هەلومەرجەکان بەسەر نێچیردا دەسەپێنن و ناچاری دەکەن بەرەو لایان بێن.

❋ ❋ ❋

ترسنۆکەکان نە شکستەخۆن و نە سەردەکەون.

❋ ❋ ❋

بەسەرهاتی مرۆڤێك، بەسەرهاتی جۆری بەشەرە.

❉ ❉ ❉

چارەنووسی هەر کەسێك لە پێشەوە دیاریکراوە.

❉ ❉ ❉

مرۆڤ هەرگیز دەست لە خەونەکانی هەڵناگرێت.

❉ ❉ ❉

خەونەکان خۆراکی رۆحن، هەر بەو جۆرەی کە خواردەمەنییەکان خۆراکی جەستەن.

❉ ❉ ❉



رێگای عەشق تەنهاڕێی دەستخستنی حیکمەتە.

❉ ❉ ❉

ئێمە باس لە عەشق دەکەین، بەڵام ئەو خۆشەویستی و خۆشگووزەرانییەی ئێمە شایەنین، وەرناگرین.

❉ ❉ ❉

ئەگەر خۆشویستنمان هەبێت، ئەگەر عەشق بکەین جیهان دەگۆڕێت.

❉ ❉ ❉

نووری عەشق تاریکییەکانی گووناه پەرشدەکاتەوە.

❉ ❉ ❉





خودایە، لە عەشقدا خۆڕاگریمان پێببەخشە.

❁ ❁ ❁

عەشق لووتبەرزی نییە، غرووری نییە.

❁ ❁ ❁

خودایە، نیشانمان بدە کە چۆن خۆمانمان خۆشبوێت.

❁ ❁ ❁

خودایە، ناچارمان بکە کە بەدوای عەشقی ئەوانی تردا بین.

❁ ❁ ❁



خودایە، ئەگەر ترسی دەرکران و نیگاسەختەکان و توندوتیژیی دڵی ئەوی تر هەبێت، هەرگیز مەهێڵە لە گەڕان و خواستنی عەشق دەستهەڵبگرین.

❁ ❁ ❁

با ئاگری عەشق دڵمان بتەنێت.

❁ ❁ ❁

ئاگری عەشق خراپییەکانمان دەسووتێنێت.

❁ ❁ ❁

ئێمە گووناهەکانی خۆمان بۆ خاتری عەشق، بۆ ئەو گۆڕانەی زەوی دەلەرزێنێت، دەشۆین.

❁ ❁ ❁





عەشق ئاراستەکەری ژیان و خەونەکانمانە.

❁ ❁ ❁

هەموومان عادەتمان بە ململانێ لەپێناوی عەشقدا گرتوە.

❁ ❁ ❁

عەشق بکەن، چونکە عەشق باڵاترین بەهرەیە نەك لە بەرامبەر ئەوەی شتێکمان پێدەدات.

❁ ❁ ❁

شەیدایی دروستکردنی وێنایەکە لە کەسێکی تردا، بەبێ ئەوەی پێیبلێین ئەم وێنەیە چییە.

❁ ❁ ❁



عەشق واتە دابەشکردنی جیهان لەگەڵ ئەوی تردا.

❁ ❁ ❁

عەشق لەگەڵ شەیداییدا جیاوازە.

❁ ❁ ❁

شەیدایی شتێکی جوانە، چێژ دەبەخشێتە ژیان و خۆشبەختییەکان زیاددەکات.

❁ ❁ ❁

عەشق بەهای هەموو شتێکی هەیە و ناکرێت بە هیچ شتێك بگۆڕدرێتەوە.

❁ ❁ ❁





کەسێ خۆشبەختە، کە تەنها بەهۆی عەشقەوە لە دونیا دەڕوانێت.

❋ ❋ ❋

ئەگەر مرۆڤ تەنها عەشق قبووڵ بکات، بەسەر هەموو کێشەکاندا زاڵ دەبێت.

❋ ❋ ❋

عەشقی خواوەند و عەشقی ئەوانی تر ڕێگەمان پێ نیشاندەدەن.

❋ ❋ ❋

عەشق هێزێکە، هەموو ئەو شتانەی لە جیهاندا هەن چاکدەکا و ژیانێکی نوێیان پێدەبەخشێت.

❋ ❋ ❋



کاتێك عاشقانە لە دونیا بڕوانین، کەمکەم عەیب و لاوازییەکانمان نامێنن.

❋ ❋ ❋

بە هێزی عەشق و ئیرادەی خۆمان دەتوانین چارەنووسمان بگۆڕین.

❋ ❋ ❋

ڕۆژێك رادەگات کە عەشق لە هەموو دڵێکدا قبووڵدەکرێت و، ترسناکترینی ئەزموونە مرۆییەکان، واتە تەنهایی- کە ئێجگار خراپترێکە لە برسێتی- لە ڕووپەڕی جیهاندا دیارنامێنێت.

❋ ❋ ❋

پشکنینی بڕواکانی عەشق هەمیشە لە هەر شتێك بەهێزترە و دەتوانێت یارمەتیمان بدات تا گەشەبکەین.

❋ ❋ ❋





خوداوەند عەشقە و سەخاوەتمەند و بەخشندە.

❋ ❋ ❋

ئەگەر ئێمە بڕوامان بە عەشقی خواوەند هەبێت، هەرگیز نابێت رێبدەین لاوازییەکانمان ئیفلیجمان بکەن.

❋ ❋ ❋

وەها بکە قسەی من شمشێری تۆ بێت، وەها بکە عەشقی من کێشانەی تۆ بێت.

❋ ❋ ❋

عەشق هەمیشە دەبێتە هۆی گەمژەیی.

❋ ❋ ❋



عەشق دەتوانێت بەسەر هەموو شتێکدا سەربکەوێت.

❋ ❋ ❋

ئێمە ناچارین بۆ سەرکەوتنی عەشقمان، چاوەڕێی کۆتاییهاتنی جەنگە ئاسمانییەکان بکەین.

❋ ❋ ❋

عەشق هەرگیز کەسێك لە خەونەکانی خۆی دانابڕێت.

❋ ❋ ❋

لە عەشقی نێوان ژن و مێرددا، موعجیزەکان بوونیان هەیە.

❋ ❋ ❋





دەتوانین عەشق لە هەموو شتێکدا ببینین.

❁ ❁ ❁

عەشق شتێکە، بە هەر جۆرێ لێی بڕوانین، بەهادارە و جێی قبووڵکردنە.

❁ ❁ ❁

عەشق، ئازادییە.

❁ ❁ ❁

باشترین ڕێگای غەرقبوون لە خودادا، ڕێگای عەشقە.

❁ ❁ ❁



کەسانی عاشق پێکەوە گەشەدەکەن و شێوەیەکی نوێی ژیان دەئافرێنن.

❁ ❁ ❁

عەشق هیچ لۆژیکێك ناناسێت.

❁ ❁ ❁

لە عەشق دەترسین، چونکە پەیوەستە بە هەندێ شتی سەرووتر لە تێگەیشتنمان.

❁ ❁ ❁

عەشق فراوانترە لە هەر شتێك و، لە عەشقدا هیچ نەفرەتێك بوونی نییە.

❁ ❁ ❁

عەشق ژیان ئاراستەدەكات.

❁ ❁ ❁

تەنها پاڵنەری جیهان، عەشقە.

❁ ❁ ❁

كەسێك كە ناتوانێت یەكێكی تری خۆشبوێت، ناتوانێت بڵێت خەونەكانی دەستەبەربوون.

❁ ❁ ❁

عەشق هەستێكی لەڕادەبەدەر وابەستەیە بە رەنگەكان، وەك بڵێی هەزاران پەلكەزێڕینە بەسەریەكدا كەڵەكە بوون.

❁ ❁ ❁



لە عەشقدا هەموو شتێك ئاشكرایە.

❁ ❁ ❁

ئەو كاتەی بە دڵێكی سەرڕێژ لە عەشقەوە كاردەكەین، سەركەوتووین.

❁ ❁ ❁

عەشق كلیلی تێگەیشتنی هەموو رازەكانە.

❁ ❁ ❁

كەسێك كە عاشقە، دەتوانێت فێری هەموو شتێك ببێت.

❁ ❁ ❁





کاتێك کە تەنهاین، تێگەیشتن لە جیهان هیچ سوودێکی نییە.

❈ ❈ ❈

ئەگەر عەشق هەستپێبکەین، تێدەگەین کە چەندە دەبێت ئازاری بۆ بچێژین.

❈ ❈ ❈

لە پەیوەندیی سێکسیدا، بە زەحمەت دەتوانرێت ئەوی تر فریوبدرێت، چونکە لەوێدا هەموو کەس نیشانیدەدات کە کێیە.

❈ ❈ ❈

زۆرێك لە خەڵکی لەبەرئەوە رێگا بەخۆیان نادەن عاشق بن، چونکە زۆرێك لە شتەکان ئەکەونە مەترسییەوە: برێکی زۆر لە ئایندە و برێك لە رابردوو.

❈ ❈ ❈



گەورەترین دێوانەیی پیاوان و ژنان هەر ئەمەیە: عەشق!

❈ ❈ ❈

عەشق دوو رووی هەیە.

❈ ❈ ❈

عەشق بەسەر خێر و شەڕدا زاڵ دەبێت.

❈ ❈ ❈

هەموو شتێك رێگەپێدراوە، جگە لە رێگریی دەرکەوتنی عەشق.

❈ ❈ ❈

عەشق بە دوای بەرژەوەندیی خۆیدا نییە، خۆی ناوێت.

❁ ❁ ❁

لەم جیهانەدا هیچ شتێکی گرنگتر لە عەشقکردن نییە.

❁ ❁ ❁

عەشقی ناوەکی هێندە گەورەیە کە هەموو شتێك دەگۆڕێت.

❁ ❁ ❁

دڵت بکەرەوە و عەشقی تێدا راخە.

❁ ❁ ❁



عەشق وەك هەر شتێك، وەك با دەگۆڕێت.

❁ ❁ ❁

هەموو ژیان جۆرێکە لە سەفەر.

❁ ❁ ❁

خودایە، رەحمێ بەوانە بفەرموو، کە لە ترسی عەشق دەمرن و بەناوی عەشقێکی باڵاتر کە ناشیناسن، عەشق دەدەنە دواوە.

❁ ❁ ❁

خودایە، رەحمێ بەوانە بکە، کە چاکەکارن و هەوڵدەدەن تەنها بەهۆی عەشقەوە بەسەر چەپەڵیدا زاڵ بن.

❁ ❁ ❁





ئەو کاتەی ئارەزووی شتێکت هەیە، تەنها دەبێت جەخت لەسەر ئەو شتە بکەیتەوە.

❋ ❋ ❋

هیچ کەسێك توانای نیشانگیریی ئامانجێکی نییە، کە تا ئێستا نەیبینیوە.

❋ ❋ ❋

عەشق هەموو رۆژێك موعجیزەی خۆی هەیە.

❋ ❋ ❋

رێگەبدەن تا هەستەکان و هەڵچوونەکانتان ئێوە لەگەڵ خۆیان ببەن، وەلێ رێکوپێك و پابەندی چوونەپێشیش بن.

❋ ❋ ❋



میهرەبانی چەندە ئاسانە، دەرکەوتەکانی کاتییە و کاریگەرییەکانی هەمیشە بە یادەوەرییەکان دەسپێردرێت.

❋ ❋ ❋

هەمیشە هەوڵدەدەین ئەوانی تر رازی بکەین، بەڵام ئەوەی کە دەبێت بیکەین شادکردنە.

❋ ❋ ❋

هەرگیز هەلێك بۆ شادکردنی ئەوی تر لەدەستمەدەن، چونکە سەرەتا خۆتان لەم کارەدا سوودمەندەبن، تەنانەت ئەگەر هیچ کەسیش نەزانێت ئێوە چی دەکەن.

❋ ❋ ❋

بەشی خۆتان جێبەجێبکەن، باشترین بەشی بوونتان.

❋ ❋ ❋





شادی لە هەبوون و قبوولکردندا نییە، تەنها لە بەخشیندایە.

❁ ❁ ❁

ئێمە لەگەڵ کەسێکدا کە باوەڕمان پێدەکات، بە جوامێری و خۆشەویستی دەگەین.

❁ ❁ ❁

تەنها ئەو کەسەی کە خۆشبەختە، دەتوانێت لە ژیانی ئەوانی تریشدا خۆشبەختی بئافرێنێت.

❁ ❁ ❁

کەسانێك دەتوانن فریشتەکان ببینن، کە نوور قبووڵدەکەن.

❁ ❁ ❁



ئەگەر کەسێك بەڕاستی ئێمەی بوێ هەموان دەیانەوێت، بەڵام ئەگەر تەنها بین، تەنهاتریش دەبین.

❁ ❁ ❁

توانست لە تەنهاییدا گەشەدەکات، کەسایەتی لە پرۆسەی ژیاندا.

❁ ❁ ❁

بە ئەندازەی خۆی گرنگی بەهەر شتێك بدەن.

❁ ❁ ❁

ئەوانەی زیاتر دەمانخەنە ژێر کاریگەرییەوە، هەمان ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بەوەی دەیڵێین، هەیە.

❁ ❁ ❁

سەبارەت بە ئارەزووەکانتان، بێپەروا مەبن.

❁ ❁ ❁

لە ژیاندا هەندێ چرکەسات هەن کە زیاتر پێویستمان بە ئازایەتییە، نەك حەزەر.

❁ ❁ ❁

ئێمە هەمیشە دەتوانین ئەو شتەی کە دەمانەوێت، بەدەستی بهێنین.

❁ ❁ ❁



جەنگاوەری ڕێگای ڕۆشنایی، دەتوانێت هاوسەنگی لە نێوان وابەستەبوون و تەنهاییدا بکات.

❁ ❁ ❁

جامی خۆڕاگریی هەموان لە بەرامبەر ئازار و دەرددا بەیەك ئەندازە نییە.

❁ ❁ ❁

هەرچەندە زیاتر لە ژیاندا بڕۆینەپێش، چرکەساتە سەختەکان زیاتر لە ژیانماندا دەردەکەون.

❁ ❁ ❁





دەبێت بۆ خۆشبەختی بجەنگین.

❁ ❁ ❁

باشترە ژیان هەر بەو شێوەیەی کە هەیە قبووڵبکەین، نەك بەو شێوەیەی بە خەیاڵماندا دێت.

❁ ❁ ❁

باشترین ڕێگە بۆ دوورکەوتنەوە لە سەرئێشە، بوونی بەرپرسیارێتییەکی هاوبەشە.

❁ ❁ ❁



## سەرچاوەکان


١- کێوی پێنجەم
٢- داستانگەلێك بۆ باوکان، منالآن و نەوەکان
٣- شەیتان و خانم پریم
٤- حاجیی کۆمپۆستێلا
٥- ڤالکیرییەکان
٦- دیدارێك لەگەڵ فریشەکاندا
٧- کیمیاگەر
٨- سەفەر بۆ دەشتی ئەستێران
٩- لە کەنار ڕووباری پیدرادا دانیشتم و گریام.
١٠- ڤێرۆنیکا بڕیاردەدات بمرێت.
١١- مەکتووب






